**بسم الله الرحمن الرحيم**

**الحمدلله رب العالمين، وصلى الله على محمد النبي، وعلى آله وصحبه وسلم**

لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا خەڵکی دەکەونە هەڵەوە و کەسیش نیە دڵسۆز بێت و ئاڕاستەی ڕاستیەکان بخاتە سەرهەڵەکانیان و بیانگۆڕێت بۆ حەقیقەت.

ئەمساڵ سەرەڕای ئەوەی کاتم بۆ ئەم بابەتە تەرخان نەکرد بەڵام بەکورتی تیشکم خستەسەر هەڵەزۆرباوەکانی خەڵکی لە مانگی ڕەمەزاندا، بۆ ئەوەی بەخۆماندا بچینەوەو ڕاستیان بکەینەوە .

زیاتر گرنگیم بەو هەڵە زەقانە داوە کە لەبەرچاون هەر هێندەش کاتم هەبوو، هەڵەی زۆر زیاتر هەیە ئاماژەم پێنەداوە بەڵام گرنگترینی هەڵەکانمان باسکردوە .

ئەم نامیلکە بچوکەی بەردەستت پێکهاتوە لە **٣٠** هەڵەی زۆرباو کەلە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا خەڵکی ئەنجامی دەدەن ، بەهیوای ڕاستکردنەوەی هەڵەکان و گەڕانەوە بۆ قورئان و سوننەت بە تێگەشتنی هاوەڵان .

وصلى الله على سيدنا و نبينا محمد صلى الله عليەوسلم

# هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ١ ـ

مانگێک پێش ڕەمەزان هەواڵ بڵاودەکاتەوە فڵانە ڕۆژ ڕەمەزانە !

یەکێکی تر لە هەڵەباوەکان هێشتا ڕەمەزان مانگێک یا زیاتری ماوە بەروارو ڕۆژی ڕەمەزان دیاری دەکات ! لەکاتێکدا هەتا مانگ نەبینرێت ناکرێ بە ڕەمەزان یان جەژن .

(صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ)

بەڕۆژووبن ئەگەر مانگتان بینی، بیشکێنن و بیکەن بە جەژن ئەگەر مانگتان بینی .

**رواه مسلم (2379)**

ئیتر هەرکەسێک لە غەیری ئەو پێوەرە نمایشی کرد من دەزانم کەی ڕەمەزانە یا جەژنە ئەوە درۆ دەکات.

ئەگەر بوترێت ؛ فەلەک و جیهازی وردبینی و زانستی سەردەم پێشکەوتووە پێمان دەڵێن : فڵان ئێوارە مانگ دەبینرێت، ئیتر بۆچی باوەڕنەکەین ؟

لە وەڵامدا دەڵێین ؛ زانست و فەلەک و جیهازەکانتان پێشکەشی خۆتان بێت و هەرگیز ناگەن بە دلیل ی قطعي و گومان لابەرێت، هەرکەسیش پشت بەوە ببەستێت لێی وەرناگیرێت و درۆ دەکات، تەنها بەو چەشنەی ئیسلام دایناوە مانگتان بینی بەو چەشنە دیاریدەکەین کە جەژن بێت یاخود ڕەمەزان .

فەلەکناسی پشت دەبەستێت بە زانستێک کە عەقڵ ئیدراکی دەکات، عەقڵیش پەی بە هەموو حەقیقەتێک نابات، بۆیە خۆتان تەسلیم وتەی پێغەمبەر ﷺ بکەن زەرەر ناکەن وەگەرنا ڕەنجەڕۆ و سەرەڕۆ دەبن.

# هەڵە زۆربادەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ٢ ـ

ئەم کاتی بانگەی دانراوە بۆ نوێژی بەیانی هەڵەی تێدایە ، دەبێت فەجری صادق ببینێرێت ئنجا نوێژی بەیانی ئەنجام بدرێت و دەست لە خواردن هەڵبگیرێت، بەڵام ئەم کاتەی لە تەقویمەکان دانراوە بۆ نوێژی بەیانی تەنانەت فەجری کاذب یش دەرنەکەوتوە نەک فەجری صادق، بۆیە دەتوانن بخۆن و بخۆنەوە وە چونە لای خێزانیش تا فەجری صادق دەردەکەوێت ئتر چونە لای خێزان و خواردن و خواردنەوە قەدەغە دەبێت و کاتی نوێژی بەیانیش دێت کە فەجری صادق دەرکەوت.

(**وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ**) **البقرة : ١٨٧**

واتە: بخۆن و بخۆنەوە و بچنە لای خێزانەکانتان هەتاوەکو ڕوناکی ڕۆژ لە تاریکی شەو جیادەکەنەوە ، پاشان کە ڕوناکی ڕۆژتان لە تاریکی شەو جیاکردەوە و فەجری صادق دەرکەوت درێژە بدەن بە ڕۆژوەکەتان تا خۆر ئاوا دەبێت.

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، بۆ جیاکردنەوەی بەرەبەیان دوو دەزوو یان دوو گوریسی بەستنەوەی وشتر یان بەکاردەهێنا کە یەکیان ڕەنگی سپی بوو یەکیان ڕەنگی ڕەش بوو .

جا ئەوەی گرنگە بیزانن دوو بەیان (فەجر) هەیە صادق و کاذب ، جا فەجری کاذب درۆزن ئەو فەجرەیە کە پێش فەجری صادق ڕاستگۆ دەرئەکەوێت و پەیدادەبێت بەناوەڕاستی ئاسماندا تێپەڕدەبێت و باریکیشە بەهاتنی ئەم فەجری کاذب ە نوێژی بەیانی کاتی نایەت و ئاساییە خواردن و خواردنەوە و چونەلای خێزان ، بەڵام فەجری صادق ڕاستگۆ ئەو فەجرەیە کە دوای فەجری کاذب درۆزن دێت و لە سوچێکی ئاسمان ەوە دێت و هەموو ئاسمان ڕۆشن دەکاتەوە سورو سپی تێکەڵە جا بەهاتنی ئەم فەجری صادق ڕاستگۆیە کاتی نوێژی بەیانیەو ئتر دەبێت دەستبگریتەوە لە خواردن و خواردنەوەو چونە لای خێزان .

جا ئەم کاتی نوێژی بەیانیەی دانراوە لە تەقویمەکاندا زۆر هەڵەی تێدایە و هێشتا بەیانی ڕاستگۆ دەرنەکەوتوە خەڵکی نوێژی بەیانی دەکات و خۆی دەگرێتەوە لە خواردن و خواردنەوە و لەو سوننەتەش بێبەش دەبێت کە پارشێو دواخستن سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بوە، وە کێشەی گەورەتر نوێژی بەیانی نەکردوە ئەمەش زۆر مەترسیدارە کە نوێژێکی فەڕزی کردوەو کاتی نەهاتوە،

ئەمە دەستکاری کردنی کاتی نوێژە و گۆڕینی بە کاتێکی تر کە ئەوەی بزانێت و بە ئەنقەست بەردەوام بێت لە گومڕاییدایە.

ئەم بابەتە لەنێو کتێبەکانی سەلەفدا دەتوانی پێی بگەیت ، وە بەزمانی کوردیش دەربارەی نوسراوە ، پێویست ناکات ئێمە درێژەی پێبدەین ، بگەڕێنەوە بۆ تفسير الطبري . صحيح البخاري . صحيح مسلم . وە غەیری ئەمانیش هاتوە بەڵام بەکورتی تیشکم خستەسەری تا ئێوەش بەدوای باسەکەدا بچن و جوهد بکەن .

# هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ٣ ـ

درەنگ بەربانگ کردنەوەو خۆسەرقاڵکردن بە خواردنی بە تام و شیرینی، بێئاگابون لە دوعاکردن لە کاتی بەربانگدا .

هەرکات خۆرئاوا بوو زەردی بەئاسمان نەما ئتر کاتی بەربانگ کردنەوەیە ، چاوەڕوان کردن بۆ بانگی بانگبێژ هەڵەیە چونکە زۆرجار ئەم بانگەی دەدرێت یان پێش یان پاش ئاوابونی خۆرە ، ئەمە زۆرێک لە خەڵکی بێئاگایە لێ.

عن سهل بن سعد.رضي الله عنه.قال: قال رسول الله ﷺ : (لا يزال الناس بخير ما عجلوا الفطر) **(متفق عليه)**

لە سهل کوڕی سعد ەوە ڕەزای اللە لێبێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی : خەڵکی لە خەیردان مادەم پەلەبکەن لە ڕۆژوشکاندن .

کەواتە ؛ چاوەڕێی بانگ مەکە بۆ ڕۆژوشکاندن ، بانگدان بۆ نوێژکردنەو خۆرئاوابوو زەردی بەئاسمانەوە نەما کاتی ڕۆژوشکاندنە و پەلەبکە لە شکاندنی ڕۆژوەکەت ، وە نزاکردن زۆر گرنگە و وازبهێنە لە شتی لاوەکی وەک ؛ شیرینی

خواردن و شەربەت گرتنەوە و ..هتد ، چونکە کاتەکەت دەڕوات و سودی لێنابینیت .

# هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ٤ ـ

## ترساندن و تووڕەبون لە منداڵ بۆ ئەوەی ڕۆژوو نەگرێت بەهۆکاری تەندروستی خراپ نەبێت !

زۆرێک لە دایکان و باوکان منداڵەکانیان دەترسێنن بەوەی برسیت دەبێ و تینو دەبی و نەخۆش دەکەویت ، ناتوانی بەڕۆژوو بیت مەیگرە !!

لە کاتێکدا ئەمە هەڵەیەکی زۆرباوی دایکان و باوکانە و بێئاگا لەوەی پێشینان ئەمریان کردوە بە منداڵەکان بە ڕۆژوگرتن ئەگەر توانیان بەڕۆژوبن.

" کاتێک منداڵەکەت بەڕۆژوە ، تۆی دایک و باوک زیاتر هانی بدە تشجیع ی بکە و ئامۆژگاری بکە و یاری و گاڵتەی لەگەڵ بکە با بێتاقەت نەبێت ، نەک تورە بیت لێی و بڵێی ڕۆژوت بۆ ناگیرێ بۆ دەیگری ! مەیگرە ! یان تورەبون لێی ڕۆژوت پێناگیرێ هەی تەمەڵ ! نا ئەو وشانە بەکارمەهێنە بەرامبەری چونکە هەڵەیە "

- أخرج البخاري : عن الربيع بنت معوذ قالت : أرسل النبي ﷺ غداة عاشوراء إلى قرى الأنصار : " من أصبح مفطرا فليتم بقية يومه، ومن أصبح صائما فليصم ".

قالت : فكنا نصومه بعد ونصوم صبياننا، ونجعل لهم اللعبة من العهن ، فإذا بكى أحدهم على الطعام أعطيناه ذاك حتى يكون عند الإفطار.

له الربيع بنت معوذ ەوە فەرمویەتی پێغەمبەر ﷺ بەیانی عاشورا دەینارد بۆ دێکانی ئەنصار ، کە هەرکەسێک بەیانی کردوە بەڕۆژوو نیە بەتەواوی ڕۆژەکا بەڕۆژوبێت ، هەرکەس بەیانی کردوە بەڕۆژوە با بەڕۆژوبێت.

وە فەرموی بەڕۆژوو دەبوین لەدوای ئەوەش منداڵەکانمان بەڕۆژوو دەبوون ، وە یاریمان بۆدەکردن گەر یەکیان بگریایە بۆ خواردن و داوای بکردایە تا کاتی ڕۆژوشکاندن.

عن هشام بن عروةَ - رحمه الله - قال : كان أبي يأمر الصِّبيان بالصَّلاةِ إذا عقَلُوها ؛ والصِّيام إذا أطاقوه .

وروي نحوه عن الزُّهري ، وابن سيرين ، والأوزاعي ، وقتادة ، وأحمد وغيرهم

(١)

لە هشام كوڕی عروة كە وتویەتی : باوكم فەرمانی بە منداڵەكان دەكرد كە نوێژ بكەن گەر عاقڵ بونایە ، وە فەرمانی پێدەكردن كە بەڕۆژووبن گەر لەتوانایاندایە.

ڕیوایەت كراوە وەك ئەوە لە الزُّهري و ابن سيرين و الأوزاعي و قتادة و أحمد وە جگە لەوانیش [1] .

(١) مصنف عبد الرزاق ، ١٥٣/٤ .

بەداخەوە دایكان و باوكانی ئەمڕۆ لە منداڵەكانیان توڕەدەبن كە نابێت بەڕۆژوبن ، زۆرجار پارشێو خەبەریان ناكەنەوە ئەمە هەڵەیەكی گەورەیە ، پێویستە هانیان بدەن و ورەیان بەرزبكەنەوە بۆ ئەوەی بەڕۆژوو بن.

# هەڵە زۆربڵاوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ٥ ـ

بێئاگابوون لە نزا و پاڕانەوە بە گشتی و کاتە گەوهەرەکان بەتایبەتر ..

خەڵکی زۆر بێئاگان لە نزاکردن، وە ئەو کاتانەشی نزا تێیدا گیرایە هەر زۆر بێئاگاترن، بۆیە گرنگی بدەن بە نزاکردن و کاتەتایبەتەکانیش ...

(وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ)

واتە : هەرکاتێ بەندەکانم لە بارەی من پرسیارت لێدەکەن: ئایا من دورم لێیانەوە یان نزیك؟ دەبێ بزانن ، من زۆر نزیکم لێیانەوە ، بەهاناو پاڕانەوەی دوعا گۆیانەوە دێم و وەڵامیان دەدەمەوە هەرکە لێم وەپاڕێن ، دەبا ئەوانیش فەرمان و داخوازی من وەڵام بدەنەوەو، فەرمانەکانم پشتگوێ نەخەن وباوەڕی تەواو بتەویان بەمن هەبێ ، بەشکو ڕێی راست بۆخۆ بەدی بکەن .

حدثني العباس بن الوليد النرسي ، ثنا يزيد بن زريع ، ثنا محمد بن عمرو ، نا أبو سلمة ، عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ (ينزل الله عزوجل إلى السماء الدنيا لنصف الليل الآخر . او ثلث الليل الآخر . فيقول : من

ذا الذي يدعوني فأستجب له ؟ من ذا الذي يستغفرني فأغفر له؟ من ذا الذي يسألني فأعطيه؟ حتى يطلع الفجر ، أو ينصرف القارئ من صلاة الصبح) .

واته : عبدالله کوڕی ئیمام ئەحمەد رحمهماالله دەڵێ عباس کوڕی ولید النرسي بۆیگێڕاوەوە لە یزید کوڕی زریع لە محمد کوڕی عەمر ، لە ئەبو سەلەمە لە ئەبو هریرە کە فەرمویەتی : پێغەمبەری الله ﷺ فەرمویەتی : الله عزوجل دادەبەزێتە ئاسمانی دنیا لە کۆتایی نیوەی شەو یان کۆتایی سێیەکی شەو . دەفەرموێت : کێ هەیە داوایەکی هەبێت با وەڵامی بدەمەوە ؟ کێ هەیە داوای لێخۆشبون بکات با لێی خۆشبم ؟ کێ هەیە شتێکی بوێت با پێی ببەخشم ؟ هەتا هاتنی فەجر یان خوێندنی قارئ لە نوێژی بەیانی .

**كتاب السنة عبدالله بن إمام احمد بن حنبل**

- عن أبي هريرة رضي الله عنه أن النبي - ﷺ - قال : «إن في الجمعة لساعة لا يوافقها عبد مسلم وهو قائم يصلي يسال الله شيئا إلا أعطاه إياه».

واته : ساتێک هەیە لەڕۆژی هەینی موسڵمان پێی ناگات کە بوەستێ و نزابکات و داوای شتێ بکات ئیلا خودا پێی دەبەخشێت.

**| سنن النسائي، مسند أحمد |**

- كان عبد الله بن سلام - رضي الله عنه - يقول : السَّاعَةُ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ مَا يُذْكَرُ : آخِرَ سَاعَاتِ النَّهَارِ.

ئەو ساتەی باسکراوە لە ڕۆژی هەینیدا بۆ نزاکردن کۆتا ساتەکانی ڕۆژە.

**| أخرجه عبد الرزاق في المصنف|**

نزاکردن چەکی بڕوادارە ، زۆر پێویستە بێئاگا نەبین لەنزاکردن وە ئەو کاتانەش کە نزا تێیدا گیرایە ، بڕوادار هەمیشە دەبێت دەم بەزیکر و نزا بێت بەڵام لە ڕەمەزاندا و لەو کاتانەش باسمان کرد زۆر تایبەتترە .

# هەڵە زۆربڵاوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ٦ ـ

خەتم کردنی زۆر و تێنەگشتن لە مانای ئایەتەکان و تدبر نەکردن تێیدا

(أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ) (سورة محمد ٢٤ : سورة النساء ٨٢)

ئایا ئەوانە بۆ لە ئایەتەکانی قورئان رانامێنن و تێنافکرێن، تا پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرن ؟

بەڵام ئاگاداری ئەوەشبن لەنێو سەلەفدا زۆر گرنگی بە خوێندنەوەی قورئان دراوە و خەتم کردنی ، کە دەڵێین پێنج یا زیاتر خەتم مەکە و یەک خەتم بکە ئەوە مەبەستمان ئەوەیە تدبر و تێگەشتن لەمانای ئایەتەکان و تێڕامان تێیدا ، ئەگینا کەسێک تدبر و ڕاوەستانی هەبێت لەسەر ئایەتەکان و خەتمی زۆریش بکات ئەوە هەر زۆرباشتر . .

كان التَّابعي قتادة رحمه اللَّه :

يختم القرآن في كلِّ سبعٍ، فإذا دخل رمضان ختم في كلِّ ثلاث ليالٍ مرَّة، فإذا دخلت العشر الأواخر ختم كلَّ ليلة مرَّة .

**حلية الأولياء وطبقات الأصفياء لأبي نعيم الأصبهاني**

تابعی بەڕێز قەتادە ڕەحمەتی الله لێبێت :

خەتمی قورئانی دەکرد لە هەموو حەوت ڕۆژێکدا ، وە ئەگەر بڕۆشتایەتە ڕەمەزان هەموو سێ ڕۆژێک خەتمێکی دەکرد ، وە گەر بگشەتایەتە دە ڕۆژی کۆتا هەموو شەوێک خەتمێکی دەکرد.

## هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ٧ ـ

ڕۆشتنی ئافرەت بۆ مزگەوت، کە توشی فیتنە و خراپە دەبێت نەک عیبادەت و پاداشت

بەداخەوە ئافرەتان دەچن بۆ مزگەوت کە باشترین شوێن بۆیان ماڵەکانیانە، بەڵام بۆ حەز و هەوەس دەچنەدەر، ئەگینا بۆ پاداشت و ڕەزامەندی ماڵ باشترین شوێنە نەک مزگەوت، بەتایبەتیش لەم سەردەمی زۆری فیتنە و شبهات ەدا و نامۆ و کەمی ئەهلی سوننەدا .

لە أبي عمرو الشيباني وە عبد الله بن مسعود ی دیوە .رضي الله عنه .کە ئافرەتانی لە مزگەوت کردۆتە دەرەوە وە ووتویەتی : " دەرچن بۆ ماڵەکانتان باشترە بۆتان " .

**مصنف عبد الرزاق الصنعاني (٥٢٥٧)**

ئافرەتانی ئەمڕۆ خۆیان بۆنخۆش دەکەن و خۆیان جوان دەڕازێننەوە و سوراو و سپیاو دەکەن ، لەنج و لار دەکەن و هەستی کوڕە لاوانمان دەبزوێنن ، دەیانەوێت پاداشتی خەیریش وەرگرن !

## هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ٨ ـ

دایکان و باوکان منداڵەکانیان فڕێدەدەنە کۆڵان ، تەنها مێشکی خۆیان ئارام بێت ئتر گرنگ نیە چی فێردەبێت و چی دەکات لە دەرەوە ! ئەمە پێچەوانەی سوننەتە ئیمالکردنی مناڵان چونکە پێغەمبەر ﷺ یاری بۆ مناڵان دەکرد

زۆرێک لە دایکان و باوکان بە عەیبەی دەزانن یاری بۆ مناڵەکانیان بکەن !

یاریان بۆ بکەن و چیرۆکی قورئانیان بۆ بخوێننەوە و قسەی خۆش و قسەی پیاوچاکانیان بۆ بگێڕنەوە لەجیاتی ئەوەی لە کۆڵان فێری وشەی نەشیاو ناتەندروست بن.

قال الإمام البخاري في « **الأدب المفرد** » :-

**٢٦٩** - حدثنا آدم قال : حدثنا شعبة قال : حدثنا أبو التياح قال : سمعت أنس بن مالك يقول : كان النبي ﷺ ليخالطنا، حتى يقول لأخ لي صغير : «يا أبا عمير، ما فعل النغير؟»

ئەنەسی کوڕی مالیک - رضي الله عنه - دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ تێکەڵاومان دەبوو، تا ئەو ئەندازەی من برایەکی بچووکم هەبوو (بێچووە باڵندەیەکی هەبوو لێی مرد، جا پێغەمبەری خوا) پێی دەفەرموو : **ئەی ئەبو عومەیڕ! بێچووە باڵندەکە چی لێهات؟**.

**٢٧٠** - حدثنا ابن سلام قال: حدثنا وكيع، عن معاوية بن أبي مزرد، عن أبيه، عن أبي هريرة: «أخذ النبي ﷺ بيد الحسن أو الحسين - رضي الله عنهما - ثم وضع قدميه على قدميه، ثم قال: (ترق).

ئەبو هورەیرە - رضي الله عنه - دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ دەستی حەسەن یان حوسەینی دەگرت، پاشان پێیەکانی لەسەر پێیەکانی خۆی دادەناو، ئینجا دەیفەرموو: بەرز بەوە (یاری لەگەڵ دەکرد و دڵخۆشی دەکرد).

# هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ٩ ـ

لە شەوانی قەدر دا گەڕانی تیپی مۆسیقا و زوڕنا بۆ وتنی سرود و گۆرانی بە دەف، بێئاگابون لە عیبادەت

کە دەمێنیتەوە لە مزگەوت ئەو دە شەوەی کۆتا ، خۆت ماندوو بکە زیاتر بە قورئان خوێندن ، زیکر بکە ، نوێژ بکە ، دوعا بکە ، عیبادەت بکە ، نەک دانیشتن بۆ گوێگرتن لە گۆرانی ! بەداخەوە مەلای مزگەوتەکان ئەو دیاردە ناشرینەیان کە بیدعەیەو حەڕامیشە هێناوەتە نێو مزگەوتەکان ! زۆر جار لە سرودەکانیشیان هاوار بۆ غەیری الله دەبرێت نعوذ بالله ، لە شەوانی قەدر دا !

| **لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ** |

عن مجاهد ، قال :

بلغني أنه كان في بني إسرائيل رجل لبس السلاح في سبيل الله ألف شهر ، فلم يضعه عنه ، فذكر ذلك رسول الله ﷺ لأصحابه فعجبوا من قوته ، فأنزل الله عزوجل : | **لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ** |

يقول الله : ليلة القدر خير لكم من تلك الألف شهر التي لبس ذلك الرجل فيها السلاح في سبيل الله ، فلم يضعه عنه ".

لە مجاهد ەوە کە فەرمویەتی : پیاوێک لە بني ئیسرائیل تفەنگی لە شانکرد لەپێناو الله عزوجل هەزارمانگ ، بەبێ ئەوەی تفەنگەکەی لە شانی لاببات ، کاتێک پێغەمبەر ﷺ ئەمەی باسکرد بۆ هاوەڵان بەڕاستی سەرسامبون بە هێزی ئەو پیاوە ، کاتێک ئەو ئایەتە دابەزی | لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ |

ليلة القدر باشتر و خەیری زیاترە بۆتان لەو هەزار مانگەی کە ئەو پیاوە تێیدا تفەنگی لە شان کردبوو لە پێناو الله عزوجل وە داینەنا لەشانی .

**( تفسير مجاهد )**

ئەو شەوە ئەوەندە گەورەو پیرۆزە هێندە کەمتەرخەمی دادەنیشیت گوێ بۆ گۆرانی و مۆسیقا و زوڕنا دەگریت ؟!

| وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا أُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُهِينٌ | **(لقمان : ٦)**

دەربارەی ئەو ئایەتە هەریەک لە (ابن عباس و ابن عمر و ابن مسعود و مجاهد و جابر و عكرمة الحسن و ابن بطة العكبري و غەیری ئەوانیش فەرمویانە مەبەست گۆرانیە) .

وە ( السعدي و السمعاني  يش لە تەفسيرەکەيدا دەڵێن ؛ مەبەست گۆرانييە ).

وە ابن القيم يش دەڵێت : تەفسيری و هاوەڵان و تابعين بۆ ئايەتەکە واتای گۆرانيە .

جا بۆيە لە قورئاندا باسی حەڕاميەتی گۆرانی و مۆسيقا کراوە وە لە فەرمودە و وتەی هاوەڵاندا باسکراوە ، ئيتر هيچ بيانويەک نيە تاوەک گۆرانی و مۆسيقا بە حەڵاڵ بزانيت وە گوێی بۆ ڕاگريت .

# هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ١٠ ـ

## وازهێنان لە خواردنی خورما و زۆرگرنیگدان بە شیرینی و بەربانگ کردنەوە بە شیرینی لە بری خورما

لە مانگی ڕەمەزاندا شیرینی زۆر دروست دەکرێت بە هەمەجۆر، جا خەڵکیش سفرەو خوانەکانیان دەڕازێننەوە بە شیرینی و زۆر گرنگی پێدەدەن و بەڕادەیەک کە خورما باشترین سودی هەیە وازی لێدەهێنن !

ناڵێین شیرینی مەکرن و مەیخۆن، بەڵکو زیادەڕەوی تێدامەکەن و زیاتر گرنگی بە خورما بدەن لە کاتی بەربانگ و پارشێو و غەیری ڕەمەزانیش .

لە ئەنەسی کوڕی مالك وە کە فەرمویەتی : پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی : پاشێو بکەن چونکە بەڕاستی لە پارشێودا بەرەکەت هەیە.

**فضائل رمضان لابن أبي دنيا**

لە ئەبو هریرة وە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی : (باشترین پارشێوی بڕوادار خورمایە) **سنن أبي داود**

## هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ١١ ـ

مانەوە لە دە شەو و ڕۆژە کۆتاکانی مانگی ڕەمەزان واتە : اعتكاف ، کە تێیدا سستبون لە عیبادەت و زۆر قسەکردن و دەمەتەقێ و خۆ سەرقاڵکردن بە نان دروست کردن ، خوێندنی قورئان زۆر بەکەمی و زۆر خەوتن ، یان وازهێنان بەیەکجاری لە نان و ئاو و خواردنێکی زۆر کەم بە ڕادەیەک تەواو لاوازبون .

زۆرێک لەگەنجان کە دەچن اعتكاف دەکەن سوچێکی مزگەوت دەکەون بە چێشتخانە ! وەک بڵێی لەدەرەوەی مزگەوت نان و ئاو نەبێت بیخۆن ! هەڵەو دیاردەیەکی زۆر ناشرینە ئاگابون هەر لای سک تێربون ! یان بەو جۆرەش وازهێنان لە نان و ئاو بەناوی زوهد و تەزکیەی نەفس ! زوهد و تەزکیەی نەفس بەوە تێگەشتوە دەست هەڵبگری لە نان و ئاو و خۆت وشک بکەیتەوە !

ئاگاداربن بشخەون و نانیش بخۆن و قسەش بکەن بەس لە بەرنامەو ئوسوڵدا ، ئینجا عیبادەتی زۆر باش و چالاک ئەنجام بدەن .

## هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ١٢ ـ

مانەوە لە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان لەمزگەوت بەڵام نوێژکردن بە تاقەت ! دوو ڕکات نوێژ و دانیشتن و شیرینی خواردن ! دوو ڕکاتی تر و دانیشتن و ئیسراحەت ! وەک بڵێی لە نوێژکردن زۆر ماندوە و بێزارە ! یان بێ بەرنامەیی لە مزگەوت و نەزانی مەلای مزگەوت و خۆ مەشغوڵکردن بە وتاری بێ مانا ! وە مەشغوڵبون بە موبایل لە مزگەوت و دیاردەی زۆر ناشرینی دەمەتەقێ و چەنەبازی لە مزگەوت !!

لەو دەشەوە کە دەمێنیتەوە زیاتر خۆت مەژغوڵ بکە بە قورئان خوێندن و زیکرو دوعا و نوێژ، واز بهێنە لە کتێب خوێندنەوەش ، واز بهێنە لە موبایلەکەت و قسەکردن چونکە شەوێکی زۆر گەورەیە گەر بو بە قسمەتت با بە قورئان خوێندن و عیبادەت ڕازاوە بێت نەک شتی بێ مانا و بێ سوود .

تابعی بەڕێز یونسی کوڕی عبید باسی دەکات کە بینیویەتی خەڵکی نوێژی تەراویحیان دەکرد لە رمضاندا دوو جار لە نوێژدا قورئانیان تەواو دەکرد - خەتم -

**فضائل رمضان لابن أبي الدنيا**

تابیعی بەڕێز حەسەنی بەصرِی فەرمویەتی :

هەركەسێك پێشنوێژی كرد لە ڕەمەزاندا با ئاسانكار بێت لەگەڵیان، ئەگەر لە خوێندنەوەدا خاوە با یەكجار خەتم بكات - لە نوێژدا -، ئەگەر لە خوێندنەوەدا خێرایە دووجار خەتمی بكات - لە نوێژدا -

**مصنف ابن أبي شيبة : ٧٧٦١**

تابعی بەڕێز ایوب السختياني لە هەر ڕكاتێكدا بە ئەندازەی سی ئایەت قورئانی دەخوێند

**مصنف ابن أبي شيبة**

سەلەف خەتم یان دەكرد یان كەمترینی **٣٠** ئایەتیان دەخوێند، لەم سەردەمەش سێ ئایەت دەخوێنی پێت دەڵێن ؛ نوێژەكەت دورو درێژە !

## هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ١٣ ـ

لەسەرەتای ڕەمەزانەوە نەخەوتن بە شەودا و دوای نوێژی بەیانی خەوتن تاوەک نزیکی عەسر ! دواتر خۆ مەژغوڵکردن بەشتی بێ سود و چون بۆ بازاڕ !

زۆرێک لە خەڵکی شەوان ناخەون بە موبایل و چونەبازاڕ کاتەکانیان بەسەردەبەن ، بەڕۆژیش دەخەون دواتریش دەڵێن بەڕۆژوبوین ! ئەم خەلەلە لە زۆربەماندا هەیە دەبێت چارەسەری بکەین ، تەنانەت لەم دەشەوەی کۆتاش لە سەرەتای شەو کەمێک بخەوە و هەستەوە تا بتوانی باشتر چالاکتر عیبادەت بکەی ، وە بە ڕۆژ بخەوە بەڵام بە بەرنامەو زیادەڕەوی مەکە .

بەداخەوە زۆرجار نوێژی نیوەڕۆ دەفەوتێنێت و نوێژی عەسریش نزیکی مەغریب دەکات ، دواتر دەڵێ بەڕۆژوبوم ! وە شەویش نەخەوتوم ! نەخەوتویت خۆ عیبادەتت نەکردوە شەهوەت و هەوەس زاڵ بوە بەسەرتدا .

نەخۆشیەکان زۆرن و چارەسەرەکانیش شیفا بەخشن بە گەڕانەوەمان بۆ بەرنامەیەکی زۆر تەندروست کە بە ڕەچاوکردنی بەرنامەی ژیانی پێغەمبەر صلى الله علیەوسلم فەراهەم دێت .

## هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ١٤ ـ

سەرقاڵبونی ئافرەتان بە دروستکردنی خواردنی جۆراوجۆر و کاتە زۆر گرنگەکانیان بە فیڕۆ دەڕوات ، وە بێ ویژدانی پیاو لە یارمەتی نەدانی خێزانەکانیان و گەڕاندنەوەی کەمێک کات بۆیان تا ئەوانیش سودمەند بن لە کات بۆ عیبادەتەکانیان .

لە مانگی ڕەمەزاندا ئافرەتان خۆیان مەژغوڵ دەکەن بە دروستکردنی کێک و شیرینی و جۆرەها خواردنی بەتام کە ڕێگری دەکات لە کاتەکانیان بۆ بەندایەتی ، کاتی نزاکردن و کاتی عیبادەتەکانیان دەفەوتیت و مایەپوچ دەبن لە بەدەست هێنانی خەرمانێک عیبادەت بۆ دوارۆژیان ، وە ئافرەتان ماندوو دەبن لە دروستکردنی خواردن و دەفرودەوری شۆردن و ماڵ پاککردنەوە و پەروردەی مناڵ ، بۆیە پێویستە لەسەر پیاوان هەموو کات یارمەتی خێزانەکانیان بدەن و بەتایبەتر لەمانگی ڕەمەزان کە بەڕۆژون زیاتر ماندو دەبن و خەمی قیامەتیان بخۆن یارمەتیان بدەن تا کاتیان بۆ بگێڕنەوە بۆ عیبادەت کردن .

بەڵێ پێویستە پیاوان ڕێچکەی کۆیلایەتی عەشایەری کۆمەڵگا بشکێنن کە کۆتی بێغیرەتیە خۆ زاڵکردن بەسەر ئافرەتاندا و یارمەتی نەدانیان بە غیرەت ناوبرێ ئەوپەڕی ترسنۆکی و زەلیلیە، پێویستە هاوکاری خێزانیان بن گەر لەخەمی دین و دنیا یانبن ئەوا کاتیان بۆ دەگێڕنەوە بە یارمەتیدانیان تا بتوانن فریاری کاتەکانیان بکەون بۆ عیبادەتکردن.

## هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ١٥ ـ

ڕۆشتن بۆ بازاڕ بەشەودا لە مانگی ڕەمەزان بوە بە دیاردە نەک بۆ پێویستی بێت ! بەتایبەتی ئافرەتانیش شەوان دەڕۆن بۆ بازاڕ ! لە کاتێکدا بازاڕ شوێنێکی ئێجگار خراپە لەبەر پێویستی نەبێت هەرگیز نەڕۆیت باشترین کارە.

ئافرەتان فێربون دەچن بۆ بازاڕ بە شەودا ! بەناوی ئەوەی شت دەکڕن و بە ڕۆژ گەرمە ناتوانن ! بازاڕیش بە شەودا هەرچی سەرسەری و خوێڕیە کۆدەبێتەوە تێیدا ! گەنجانێک کە عەقڵ و ژیریان هەموی بوە بە جنس ! ئافرەتانیش خۆیان دەڕازێننەوە و دەچن خۆیان نمایش دەکەن و هەستی کوڕە لاوان دەبزوێنن !

كان عبد اللَّه بن مسعود .رضي اللَّه عنه . إذا دخل السُّوق قال : اللَّهمَّ إنِّي أعوذُ بكَ من هَوَشات السُّوق .

عبدالله کوڕی مسعود کە دەچوە بازاڕ دەیفەرموو : پەروەردگار پەنات پێدەگرم لە " هَوَشات " ی بازاڕ.

- هوشات السُّوق : ما يحدث في الأسواق من الضَّلال والفساد والاختلاط والغبن.

هَوَشات السُّوق : بريتيە لەهەرقسەيەک لەبازاڕەکاندا لە گومڕايی و خراپە و تێکەڵاوی " تێکەڵی پياو و ئافرەت " و فرِوفێڵ " فرِوفێڵی لە مامەڵە و پارە و پول ..

**سنن سعيد بن منصور ‹ ٦٢٤٦ ›**

ئەی حاڵی بازاڕی ئەمڕۆ دەبێت چۆن بێت ! هەر لە فيتنەی ئافرەت و نەپۆشينی جلوبەرگی شەرعيان و فرِوفێڵ و دزی و مەيخانە و مادده هۆشبەرەکان و شوێنی فاحيشەو خراپەکاری بە ئاشکرا ڕێگەی پێدراوە !

ئەی دەبێت لەنێو ئەو هەموە هوشات ی بازاڕە دەبێ حاڵی موسڵمان چۆن بێت و چۆن ڕەفتار بکات و خۆی بپارێزێت !

سەلەف ئاوابون کە دەچونە بازاڕ بەو جۆرە نزايان دەکرد الله بيانپارێزێت ، ئەوان بەو لەخواترسان و دينداريەوە ئاوا خەميان هەبوە ، ئێمەش بەم کەم دينداری و عيبادەتە ئاوا خەمساردين !

# هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ١٦ ـ

## دەرکردنی منداڵان لە مزگەوتەکان و توڕەبون لێیان و عاجزکردنیان پێچەوانەی سوننەتە

لە زۆربەی مزگەوتەکان مناڵان دەردەکرێن و قسەی نەشیاویان پێدەڵێن ، زۆرجاریش لێیاندەدرێت ، لەکاتێکدا ئەمە پێچەوانەی سوننەتە .

منداڵ نابێت دەربکرێت لە مزگەوت و وە ناشبێت فێرنەکرێت و وازی لێبهێنرێت قسەی نەشیاو بکات و بە بێ پەروەردە وازی لێبهێنرێت .

قال أبو قتادة رضي الله عنه: رأيت رسول الله ﷺ وأمامة بنت العاص -ابنة زينب بنت الرسول ﷺ - على عاتقه، فإذا ركع وضعها وإذا رفع من السجود أعادها.

**(رواه البخاري ومسلم)**

ئەبو قەتادە ڕەزای الله لێبێ فەرمویەتی : پێغەمبەرم بینی ﷺ ئومامە کچی عاص کە کچی زەینەبی کچی پێغەمبەرە ﷺ لەسەر شانی بوو، کاتێک بەرز بوایەوە دایدەنا کاتێک بچوایە سوجدە دوبارە دەچوە سەرشانی .

بەڵام بەداخەوە خەڵکی مناڵان دەتۆرێنن لە مزگەوتەکان و دەریان دەکەن و لێیان دەدەن .

# هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ١٧ ـ

بێئاگابون لە زیکرو یادی الله ، وە وازهێنان لە زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران و خەوتنان

زۆرێکمان تەرکی زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران و خەوتنانمان کردوە ، لەکاتێکدا لە زیکرو یادی الله چارەسەر و شیفا هەیە ، وە بەتایبەت لە مانگی ڕەمەزان پاداشتی زیاتری هەیە زیکرکردن ، پێویستە ئەم هەڵەمان چارەسەر بکەین و هەمیشە لەخزمەت زیکرو یادی الله عزوجل بین .

ئیمامی زوهری ئەڵێت:

سبحان الله یەک لە ڕەمەزان لە هەزار سبحان الله لە غیری ڕەمەزان باشترە.

**(فضائل رمضان ابن أبي الدنيا)**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ" - دَوَاءٌ مِنْ تِسْعَةٍ وَتِسْعِينَ دَاءً، أَيْسَرُهَا الْهَمُّ )

لە ابوهريرة وە ڕەزای خوای لێبێت فەرمویەتی : پێغەمبەری الله ﷺ فەرمویەتی : "لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ "چارەسەری نەوەد و نۆ نەخۆشیە كە ئاسانترینیان خەم و پەژارەو بێتاقەتیە"

**(الفرج بعد الشدة لابن أبي الدنيا )**

# هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ١٨ ـ

## دەرکردنی زەکاتی سەرفیترە لە سەرەتای مانگی ڕەمەزان هەڵەیە

زەکاتی سەرفیترە لە ڕۆژی جەژن پێش نوێژی جەژن ودوای نوێژی بەیانی دەردەکرێت ، یان بە ڕۆژێک یا دوو ڕۆژ پێش جەژن دەردەکرێت .

وَعَن ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: "فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زَكَاةَ الْفِطْرِ طُهْرَةً لِلصَّائِمِ مِنَ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ، وَطُعْمَةً لِلْمَسَاكِينِ، فَمَنْ أَدَّاهَا قَبْلَ الصَّلَاةِ فَهِيَ زَكَاةٌ مَقْبُولَةٌ، وَمَنْ أَدَّاهَا بَعْدَ الصَّلَاةِ فَهِيَ صَدَقَةٌ مِنَ الصَّدَقَاتِ".

**رَوَاهُ أَبُو دَاوُد وَابْنُ مَاجَهْ**

لە ابن عباس ەوە ڕەزای الله لێبێت فەرمویەتی : پێغەمبەر ﷺ زەکاتی سەرفیترەی فەڕز کرد کە ئەم زەکاتە بۆ پاک بونەوەی ڕۆژوانە لە قسەیەک کە سودی نیە کردویەتی یان قسەیەکی هەڵە و قسەی ناشرین ، وە خۆراک بۆ هەژاران ، جا هەرکەسێک پێش نوێژی جەژن زەکاتی سەرفیترەکەی بدات ئەوە زەکاتێکی قەبوڵ کراوە، وە هەرکەسێکیش دوای نوێژی جەژن زەکاتی سەرفیترەکەی بدات ئەوە تەنها صەدەقەیەکە لە صەدەقەکان .

قال أبو داود في **سننه ( ٢ / ١١١ )** : بۆیگێڕاینەوە عبداللە کوڕی محمد النفيلي، بۆیگێڕاینەوە زهير، بۆیگێڕانەوە موسى کوڕی عقبة لە نافع لە ابن عمر فەرمویەتی : پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردین بەدەرکردنی زەکاتی سەرفیترە پێش دەرچونی خەڵکی بۆ نوێژ، ابن عمر زەکاتی سەرفیترەی دەدا بە ڕۆژێ یا دوو ڕۆژ پێش جەژن .

# هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ١٩ ـ

زەکاتی سەرفیترە بە موشریك و کافر و زەندیق و جگە لە موسڵمان ! کاتێك زەکاتی سەرفیترە دەردەکات گرنگ نیە بە کێی دەدات ؟!

یەکێکی تر لە هەڵەکان ئەوەیە زەکاتی سەرفیترەکەی دەدات بە جگە لە موسڵمان ! زەکاتەکەی دەدات بە موشریک ! کافر ! زەندیق ! مورتەد ! عەلمانی ! دیموکراسی ! ....

- أَخْبَرَنِي محمد بن علي، قَالَ: حَدَّثَنَا صالح أنه قَالَ لأبيه: يعطى من الزكاة مشرك، أو يهودي، أو نصراني؟

قَالَ: لا يعطى إلا المسلمون.

هەواڵی پێدام محمد کوڕی علي کە وتویەتی : بۆیگێڕاینەوە صالح کە بەڕاستی وتویەتی بە باوکی : زەکات دەبەخشرێت بە موشریک و یەهودی و نەصرانی ؟ فەرموی :

نەخێر نابەخشرێت مەگەر موسڵمانان نەبێت .

**| أحكام أهل الملل للخلال |**

- زەکات نابەخشرێت بە موشریک و بەندەیەک کە نەصرانی و یەهودی بێت ، مەگەر لە موسڵمانان بێت .

**( مسائل الكوسج ٦٤٩ )**

# هەڵە زۆربڵاوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ٢٠ ـ

کەسێک کە نەخۆشە و پزیشك مۆڵەتی پشودانی پێداوە بەوەی گەر بەڕۆژوو بێت زیان بە تەندروستی دەگات، بەڵام نەخۆشەکە ملەجەڕێ دەکات و هەر بەڕۆژوو دەبێت !

ئەی نەخۆشی ئەزیز تۆ لە تاقیکردنەوەدایت و دەبێت ئارام بگریت وە دەبێ ڕێنماییەکانی پزیشك جێبەجێ بکەیت تا تەندروست باش بیت ، وە شەرعیش ڕێگەی پێداویت کە بەڕۆژوو نەبیت بۆیە خۆت توشی زیان مەکە ..

زۆرجار نەخۆش ترسی ئەوەی هەیە دەڵێ ڕۆژوم بۆ ناگیرێتۆ دوای مانگی ڕەمەزان ! یان هەر بیانویەکی تر ! ئەمە تەنها خۆ هەڵخەڵەتاندنەو زەرەردانە لە تەندروستی خۆت .

| وَمَنْ كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ |

ئینجا ئەوکەسەشتان نەخۆش و لەش بەبارە، یا لەسەفەرەو ڕێبوارەو، ڕۆژووەکەشی دەشکێنێ ، دەبێ لە ڕۆژانی دیکەدا، چەند ڕۆژێکی تر بەقەزا بگرێتەوە .

# هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ٢١ ـ

بێئاگابون لە نوێژی تەوبەکاران " نوێژی چێشتەنگاو "

" صلاة الضحى " ، زۆرێک لە خەڵکی ئەم نوێژە ناکات لە مانگی ڕەمەزان و جگە لەمانگی ڕەمەزانیش ! "

عن أبي ذر رضي الله عنه عن النبي ﷺ أنه قال : «يُصْبِحُ عَلَى كُلِّ سُلَامَى مِنْ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ، فَكُلُّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةٌ، وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ، وَنَهْيٌ عَنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ، وَيُجْزِئُ مِنْ ذَلِكَ رَكْعَتَانِ يَرْكَعُهُمَا مِنَ الضُّحَى».

**[أخرجه مسلم]**

ئەبو ذر دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی : هەرچی جومگە لە لەشی هەر یەکێکتاندا هەیە خێرێکی لەسەرە ، هەر ( سبحان الله ) یەک خێرێکە ، هەر ( الحمدلله ) یەک خێرێکە ، هەر ( لا اله الا الله ) یەک خێرێکە ، هەر ( الله اکبر ) یێک خێرێکە ، فەرمان کردن بە چاکە خێرێکە ، ڕێگری لە خراپە خێرێکە ، دوو ڕکاتی چێشتەنگاو جێی ئەمانە هەموو دەگرێتەوە .

# هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ٢٢ ـ

## مشتومڕ و دەمەدەمێ و شەڕکردن لەسەر بابەتی زەکاتی سەرفیترە بە خۆراک بدرێت یان پارە

مەعلومە کەس ئینکاری ئەوە ناکات زەکاتی سەرفیترە بە خۆراك دراوە لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام لەنێو سەلەفدا بە پارە ئەو زەکاتە دەرکراوە و پێویست ناکا دوبەرەکی دروست ببێت بەخۆراك بدرێت یان بە پارە هیچ کێشەیەك نابێت .

لە (**مصنف ابن ابي شيبة ، مكتبة الرشد ناشرون ـ المملكة العربية السعودية . الرياض . طريق الحجاز ، الجزء الرابع ، ط : ١ ، ١٤٢٥ هـ ـ ٢٠٠٤ م**) بابێکی داناوە سەبارەت بە دەرکردنی زەکاتی سەرفیترە بە قیمەت تێیدا هاتوە :

**١٠٤٦٣** - بۆیگێڕاینەوە وکیع لە قرة فەرمویەتی : بینیمان کتابی عمر کوڕی عبدالعزيز دەربارەی صەدەقەی سەرفیترە نیو صاع بۆ هەر مرۆڤێك یان بە قیمەتەکە نیو درهەم .

**١٠٤٦٤** - بۆیگێڕاینەوە وكیع لە سفیان ەوە لە هشام لە الحسن فەرمویەتی : كێشەی نیە بەخشینی درهەم لە صەدەقەی سەرفیترەدا .

**١٠٤٦٥** - بۆیگێڕاینەوە أبو أسامة لە زهیر فەرمویەتی : بیستم لە أبا إسحاق دەیوت : زانیومانە لە صەدەقەی ڕەمەزان بەخشیویانە درهەم بە قیمەتی خۆراك .

مەزهەبی " سفیان الثوري " و " الحسن البصري " و ئەمیری بڕواداران " عمر بن عبدالعزیز " و إسحاق ە كە دەركردنی زەكاتی سەرفیترە بە پارە و قیمەت.

ئەوانەی دەڵێن دروست نیە بە پارە زەكاتی سەرفیترە بدرێت وە بیدعەیە بە پارە بدرێت ! ئایا ئەو جورئەتە دەكەن بە " سفیان الثوري " و " الحسن البصري " و ئەمیری بڕواداران " عمر بن عبدالعزیز " و إسحاق بڵێن : بیدعەچی ؟ مبتدع ؟ نعوذبالله ..

ئایا ئەوان نەیانزانی ئێوە دەزانن ؟؟

ئەوان لە دینەكە تێنەگەشتون ئێوە تێگەشتون ؟؟

ئەوان نەیانپێكاو خەسارەت مەند بون بەڵام ئێوە پێكاتان ؟؟

ئەم چەواشەكاریە بەسە ئتر بەناوی موەحید و مەلای عەقیدە پاک و فلانی و فلانی ... ، ئەم بێئەدەبی كردنە ڕابگرن بەرامبەر بە سەلەف ، چیتر بەسە ئەم بچوک بیركردنەوە و دەمارگیریە ناپەسەندە ...

بابەتی زەکاتی سەرفیترە هەموو ساڵێک مشتومڕی لەسەر دروست دەبێت ، بابەتێکە موسڵمانی لەسەر تەکفیر ناکرێت و بابەتێکی فقه یە جابۆیە لەنێو سەلەفدا ئەو دوو بۆچونە هەیە هەرگیز نەکەن بۆچونێکیان بگرن و قسە بەوی تریان بڵێن ئەوە هەڵەیەکی زۆر خەتەرە ، هەرکەس هەرکامیان هەڵدەبژێرێت بەڵگەی پێیە بەڵام باشترە بەخۆراک بیدەیت و ئەوەشی بە قیمەت دەریکرد موناقشە مەکەن.

# هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ٢٣ ـ

کەسێك سێ دەقە پێش بانگ ئیمساك دەکات لە مینبەری مزگەوت هاوار دەکات ڕەحمەتان لێبێت دەست هەڵبگرن لە خواردن و خواردنەوە

سەرەتا دوو فەجر هەیە وەک لەسەرەتاشدا باسمان کرد : فەجری صادق و فەجری کاذب ، فەجری کاذب سەرەتا دێت کە ئاسایی خواردن و خواردنەوە و چونە لای خێزان کێشەی نیە بەڵام نوێژی بەیانی کاتی نیە ، فەجری صادق دوای فەجری کاذب دێت کە خواردن و خواردنەوە و چونە لای خێزان قەدەغە دەکات و کاتی نوێژی بەیانیە ، جا ئەم بانگی بەیانیەی بەپێی تەقویمەکان دەدرێت زۆر ناڕاستە و هێشتا هەر شەوە بانگ دەدرێت ، جارێ بانگەکە هەر هەڵەیە کاتەکەی وە گەر گریمان ڕاستیش بێت کاتی بانگەکە ئەو ئیمساك ە هەڵەیە چونکە پێت دەڵێ دەست لە خواردن و خواردنەوە هەڵگرە کە ئەمەش تەنها بە هاتنی فەجری صادق قەدەغە دەبێت ، واتە فەجری صادق هات ئنجا بانگی نوێژ دەدرێت دەی ئیمساك چەند خولەکێک پێش بانگە و بۆ دەستهەڵگرتن لە خواردن و خواردنەوە پێویستە فەجری صادق دەربکەوێت وە بانگ دەدرێت .

# هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ٢٤ ـ

دانیشتن بەدیاری زنجیرە دراماکان و وازهێنان لە قورئان خوێندن و عیبادەت کردن ، بەتایبەت ئافرەتان گرنگی بە زنجیرە دراماکان دەدەن

شەوانی مانگی ڕەمەزان دانیشتن بە دیاری زنجیرە دراماکان هەڵەیەکی باوی خەڵکیە و بەتایبەت ئافرەتان ، کە ڕەوشت و سلوکی زنجیرە دراماکان وەردەگرن کە زۆر پێچەوانەی شەریعەتە.

کاتێک ئافرەتان لەبەر زنجیرە دراماکان کاتی ئەوەیان نەبوو منداڵەکانیان پەروەردە بکەن دەبێ چی منداڵێک دەربچن ؟!

واللە المستعان...

ئەم دایکانە کەسە گەورەکانیان چۆن پەروەردە کرد ؟!

ئافرەتانێک هەن لە مێژووی موسڵمانان کەوا کەسانێکی گەورەیان دروست کرد کە مێژوو ناویانی هێڵاوە تاوەک و ئێستاش و وەک ڕەمزێکن بۆ ئایینی ئیسلام و سەرخستنی، لەوانە:

- دایکی ئیمامی مالیک

- دایکی ئیمامی شافعی

- دایکی ئیمامی ئەحمەد

- دایکی ئیمامی بوخاری

- دایکی ئیمامی مالیک:

عالیەی کچی شریکی کوڕی عبدالرحمانی ئەسدی، کوڕەکەی لەمنداڵیەوە نارد بۆ لەبەرکردنی قورئان، وە دەینارد بۆ مەجلیسی گەورە زانایان و باشترین پۆشاکی لەبەردەکرد و عەمامەیەکیشی لەسەری دەکرد تا بەجوانترین شێوە دەربکەوێت، پاشان دوای ڕازاندنەوەی پێی دەگووت: ئێستا بڕۆ بنوسە و زانست وەربگرە ئەی مالیک!

دایکی تەنها بەڕازاندنەوەو شێوەی کیفایەتی نەدەکرد کە جوانترین جلی بۆ هەڵبژێرێت، بەڵکو شەیخەکانیشی بەوپەڕی وردیەوە بۆ هەڵدەبژارد و نەیدەناردە لای هەموو کەسێک.

بە مالیکی دەگووت: بڕۆ بۆلای ربیعە، لەئەدەبیەوە فێربە پێش ئەوەی لە زانستەکەی فێربی!

بەم شێوەیە ئیمامی مالیک بووە چیایەک لە چیایەکانی زانست و زانایانی مەدینە، وە لەگەورەترین زانایانی ئوممەتی ئیسلامی!

- دایکی ئیمامی شافعی:

مێردەکەی وەفاتی کرد دوای لەدایک بوونی شافعی بە ماوەیەکی کەم، شافعی بە یەتیمی گەورەکرد و پێی گەیاند.

دایکی کەسێکی زۆر زیرەک و ناوازەبوو، وە کەسێکی شارەزاشبوو لە دین، هێزێکی زۆری سەرف کرد و چەندین شەوانی بەسەربرد لەپەروەردەکردنی شافعی و دیاری کردنی ڕێگای زانست بۆی!

وە لە غەززەوە ناردی بۆ مەککە تا زمانپاراوی ئەوێ وەربگرێت و کارامەبێت تێیدا.

ئەم تێکۆشانەی دایکی ئەو ئیمام شافعیەی لێ دەرچوو کە تائێستاش مێژوو ناوی هێشتۆتەوە و لەهەموو جیهاندا کتێبەکانی دەخوێندرێت!

- دایکی ئیمامی ئەحمەد:

صەفیەی کچی عبدالملکی شەیبانی، ئیمامی ئەحمەدی بوو لە کۆتایی سەدەی دووەم لە بەغداد، باوکی وەفاتیکرد کە هێشتان ئەحمەد منداڵ بوو، خێزانێکی زۆر هەژار بوون و دایکی هەموو ئەرکێکی گرتەئەستۆ لە پەروەردەکردن و بەخێوکردنیشی بەدابین کردنی بژێوی ژیانیان.

ئیمامی ئەحمەد دەڵێ:

دایکم قورئانی پێ لەبەرکردم لەکاتێک هێشتان دە ساڵ بووم، وە دەیفەرموو:

دایکم بەیانیان زوو هەڵی دەستاندم جوانترین جلی لەبەردەکردم، وە ئاوی بۆگەرم دەکردم پێش نوێژی بەیانی و دەیناردم بۆ نوێژ پاشان بۆ مەجلیسی عیلم و لەناو حیجابەکەی دا دایدەپۆشیم تا سەرمام نەبێت لە ڕێگادا تا دەگەیاندمە شوێنی مەبەست!

وە نەیشی دەهێشت من کاربکەم و دەیگووت تۆ خەریکی زانستەکەت بەو کەمتەرخەمی تێدامەکە!

وە کاتێک تەمەنم بووە 16 ساڵ پێی گووتم:

کوڕەکەم بڕۆ بۆ داواکردنی فەرموودە و گەشت بکە، چونکە گەشت کردن لەپێناو زانست هیجرەت کردنە لەپێناو خودا.

پەروەردەی ئەو دایکە خەم خۆرە ئەو ئیمامی ئەحمەدەی دروست کرد، کە خەمی چرکە بەچرکەی کوڕەکەی بوو کە بەفیڕۆی نەدات بەڵکو بەدونیایشی خەریک نەبێت و ئەو کارە دونیاییەکانی بۆ بکات تا کاتی بۆ بگەڕێنێتەوە لەپێناو زانستەکەی!

- دایکی ئیمامی بوخاری:

ئیمامی بوخاریش باوکی وەفاتی کرد لەکاتێک هێشتان زۆر بچووک بوو و دایکی بەخێوی کرد.

هەر لە بچووکیشیەوە چاوەکانی لەدەست دا و دایکی ئەوەندە بۆی گریا و پاڕایەوە تا لەخەونی دا پێغەمبەر ئیبراهیمی بینی کە پێی فەرموو ئەوە کوڕەکەت چاوەکانی بۆ گەڕێندرایەوە بەهۆی زۆری دوعایەکانت!

دایکی هەوڵی زۆری دا تا پەروەردەیەکی دروستی کوڕەکەی بکات و توانایەکانی بەفیڕۆنەچێت. دەینارد بۆ مزگەوت و حەلقە علمیەکان، دەینارد بۆلای شێخەکان و زۆرینەی کاتەکانی لەخزمەت کتێب و نوسین و لەبەرکردن دابوو بەتایبەت بابەتی فەرموودەکان.

وە ڕێگەیشی دا کە بچێت بۆ داواکردنی زانست لە وڵاتان و بۆماوەیەکی زۆر دووربێت لە دیداری و خۆی کردە قوربانی لەپێناوی ڕێبازە زانستیەکەی ئەودا.

خۆ گەر ئەو دایکە خۆفیداکەرە بوونی نەبووایە و ڕێگەینەدابا کوڕەکەی چەندین ساڵ لێی دووربکەوێتەوە، صەحیحی بوخاری بوونی نەدەبوو کە 16ساڵی لەپێناو تەرخان کرد و بێ شوومار وڵاتان و شار و گوندی بڕی تا فەرموودەکانی کۆکردەوە...

هەموو خەمی دایکانی ئەوان ئەوەبوو کوڕەکانیان کاتەکانیان بەفیڕۆنەدەن لەپێناو دونیا و هەموو خەمیان ئەوەبوو قیامەتیان بۆ ئاوەدان بکەنەوە بە بڵاوکردنەوەی زانستی شەرعی و ئایینی خودای پەروەردگار بەڵام ئافرەتانی ئەمڕۆ بێئاگان ! کێ بە ئاگایان بێنێتەوە تا زانایان دروست بکەن!

کەی ئافرەتانمان ئاشنابوونەوە بەم دیمەنانە و قیامەتی ڕۆڵەکانیان پێشخست بەسەر دونیایان، ئینجا موسڵمانان دەگەنەوە بەو ئاستە بەرزەی کە هیوای پێ دەخوازن.

ئەی ئافرەتان...

دایکانی زانایانمان بکەنە پێشەنگی خۆتان و لاساییان بکەنەوە!

## هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ٢٥ ـ

ئیسراف کردن و زیادەڕەوی لە دروستکردنی خواردن و کڕینی شیرینی ، هەموو خەمێك تەنها سک تێربون ، بێ ئاگابون لە هەژاران

لە مانگی ڕەمەزاندا لەسەر خوانەکان زۆرێک زیادەڕەوی دەکرێت و زۆرجار ئەو چێشت و نانەی دروست کراوە فڕێدەدرێت ، وە هیچ ئاگایان لای هەژاران نیە .

| كُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ |

دەسا لە حەڵاڵ بخۆن و، بخۆنەوەو، هەرگیز زۆر خۆریی و زیادەڕەویی مەکەن ،چونکە خوا خۆشی لەوانە نایە ئەندازەشکێنی دەکەن و، لەسنوور دەردەچن.

## هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ٢٦ ـ

ڕەزیلی و حەق نەدان بە ماڵ و منداڵ و خێزان ، شت نەکڕین لەم مانگەدا و خۆ جیاکردنەوە و خۆ نامۆکردن

لە مانگی ڕەمەزاندا پێویستە ڕەزیل نەبن ، چونکە بەڕۆژ بەڕۆژوو دەبن و بەشەویش نوێژ دەکەن ، پێویستە حەقی خێزانت بدەیت ، مریشک و گۆشت و میوە و شیرینی و خواردنی بەتام بکڕە ، بەڵام زیادەڕەوی تێدامەکە ، ڕەزیل مەبە، ماڵ و منداڵ و خێزانت حەقیان بەسەرتەوە هەیە.

هەرگیز ڕەزیلی ڕەوشتی بڕوادار نیە..

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ:

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : (خَصْلَتَانِ، لَا تَجْتَمِعَانِ فِي مُؤْمِنٍ: الْبُخْلُ وَسُوءُ الْخُلُقِ)

لە أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ یەوە کە فەرمویەتی : پێغەمبەری الله صلى الله عليەوسلم فەرمویەتی : دوو تایبەتمەندی هەیە هەرگیز کۆ نابێتەوە لە بڕواداردا:

یەکەمیان / ڕەزیلی

دووەمیان /ڕەوشتی خراپ.

**( مداراة الناس لابن أبي الدنيا )**

# هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ٢٧ ـ

بێئاگابون لە خێرو صەدەقە، لەخەمی ژیانی خۆت و وازهێنان لە هاوکاریکردنی هەژاران

لەم مانگە پیرۆزەدا جێی خۆیەتی ئەو هەڵەمان ڕاست بکەینەوە ئەویش بێئاگابونە لە خێرو صەدەقە ، با چیتر بەئاگا بێینەوە و ئاگامان لەیەکتر بێت ، هەژاران خوشک برای ئێمەن ، پێویستە یارمەتیان بدەین.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْصَّدَقَةِ، دُعِي مِنْ بَابِ الْصَّدَقَةِ) .

**الْبُخَاريّ (١٨٩٧)**

واتە: هەر کەسێك لە ئەهلی خێرو صەدەقە بێت، ئەوا لە دەرگایەك لە دەرگاکانی بەهەشتەوە بانگ دەکرێت بۆ ناو بەهەشت کەناوی ئەو دەرگایە ( الْصَّدَقَةِ ) .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ: وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَّقَةٍ فَأَخْفَاهَا حَتَّى لاَ تَعْلَمُ شِمَالُهُ مَا تُنْفِقُ يَمِينُهُ) .

**الْبُخَارِيّ (٦٦٠)**

واتە: حەوت کۆمەڵ هەن پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا دەیان خاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە، لەو ڕۆژەدا هیچ سێبەرێك نییە جگە لەو سێبەرە: پیاوێك خێر دەکات و دەبەخشێت بەشاراوەیی، ئەگەر بەدەستی ڕاست ببەخشێت نایەڵێت چەپی پێی بزانێت.

## هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ٢٨ ـ

بێئاگابوون لە نزاکردن لە کاتی خەتمکردنی قورئان

قال عبد الرحمن بن الأسود:

يذكر أنه يُصلى عليه إذا ختم.

عبد الرحمن کوڕی ئەسوەد دەیفەرموو :

فریشتەکان سەڵاوات - دوعا - لەسەر ئەو کەسە دەدەن کە قورئان تەواو دەکەن

وعن الحكم قال:

كان مجاهد، وعبدة بن أبي لبابة، وناس يعرضون المصاحف، فلما كان اليوم الذي أرادوا أن يختموا أرسلوا إلي وإلى سلمة بن كهيل فقالوا: إنا كنا نعرض المصاحف فأردنا أن نختم اليوم فأحببنا أن تشهدونا، إنه كان يقال: إذا ختم القرآن نزلت الرحمة عند خاتمته أو حضرت الرحمة عند خاتمته.

حەکەم دەیفەرموو :

موجاهید و عەبدەی کوڕی ئەبی لوبابە وە چەند کەسانێکی تر قورئانمان دەخوێند - بۆ فێربوون بەسەر مامۆستادا - ، ئەو ڕۆژەی کە دەیانویست خەتمی بکەن دەیانناردە بە دوای من و سەلەمەی کوڕی کوهەیل وتیان :

ئێمە قورئانمان دەخوێند - بۆ فێربوون بەسەر مامۆستادا - ویستمان قورئان تەواو بکەین ئەمڕۆ ویستمان ئێوە ئامادەمان بن ، دەوترا ؛ کاتێک قورئان خەتم دەکرێت ڕەحمەت و بەزەیی دادەبەزێت لەکات تەواوبوونی ، یان ڕەحمەت و بەزەیی ئامادە دەبێت لە کاتی تەواوبوونی .

وفي لفظ: قال الحكم:

أرسل إلي مجاهد، فقال: إنا دعوناك، إنا أردنا أن نختم القرآن، فكان يقال: إن الدعاء مستجاب عند ختم القرآن، ثم دعا بدعوات.

لە لەفزێکی تردا ، حەکەم فەرموویەتی :

موجاهید ناردی بەدوامدا ، وتی ئێمە بانگمان کردی ،ویستمان قورئان خەتم بکەین ، دەوترا ؛ دوعا کردن لە کاتی خەتم کردنی قورئاندا وەردەگرێت ، پاشان چەند دوعایەکی کرد

**[مصنف ابن أبي شيبة وفضائل القرآن للفريابي]**

# هەڵە زۆرباوەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ٢٩ ـ

## وازهێنان لە نوێژی تەراویح و هەڵنەستان بۆ شەونوێژ وە هەڵنەستانی ماڵەوە بۆ شەونوێژ

بەداخەوە کەسانێک نوێژی تەراویح ناکەن بەبیانوی ئەوەی سوننەتە ! پێگەی سوننەت زۆر گەورەیە و ئەوە لە کەمکردنەوەی قەدری سوننەتە ، ئەوەی وا بیردەکاتەوە پێویستە تەوبە بکات ، پێویستە موسڵمان تموحی گەورەی هەبێت و نوێژە فەرزەکانی لە کاتی خۆیدا بکات و تەراویح یش ئەنجام بدات ، وە شەو کە خەوت زوو هەستێت دەستنوێژ بشوات و قورئان بخوێنێت و زیکر بکات و شەونوێژیش بکات.

﴿فَإِذَا فَرَغْتَ فَانصَبْ﴾

عن عبدالله بن مسعود قال: «إذا فرغت من الفرائض فانصب في قيام الليل»

پێشەوا عبداللە کوڕی مەسعود دەربارەی ئایەتەکە فەرموویەتی :

«کاتێک تەواو بووی لە فەڕزەکان خۆت ماندوو بکە بە کردنی شەونوێژ »

**[ تفسير ابن أبي حاتم ]**

قال معتمر بن سليمان -رحمه الله-: كان أبي يوقظُ كلَّ من في الدَّار إذا دخل شهر رمضان ويقول: «قوموا فلعلَّكم لا تدركوه بعد عامكم هذا»

موعتەمیری کوڕی سولەیمانی تەیمی فەرمویەتی : باوکم هەموو کەسەکانی ناو ماڵەکەی هەڵدەساند لە خەو کاتێک مانگی ڕەمەزان دەهات و دەیفەرموو : «هەستن لە خەو لەوەیە ساڵێکی تر نەگەنەوە بە ڕەمەزان».

**(موسوعة ابن أبي الدنيا )**

كان الصَّحابي قرَّة بن إياس -رضي الله عنه- يقول لبنيه إذا صلوا العشاء: « يا بَنيَّ ناموا؛ لعلَّ الله أن يرزقكم من اللَّيل خيراً»

هاوەڵی بەڕێز قوڕڕەی کوڕی ئیاس رضي الله عنه کاتێک کوڕەکانی نوێژی عیشایان دەکرد پێی دەوتن : « کوڕەکانم بخەون، بەشکم خوای گەورە لە شەودا خێرتان پێ ببەخشێت و هەستن نوێژ بکەن».

**( الزهد للإمام أحمد ‹ ١٠٤٠ › )**

قال طلحة بن مصرف -رحمه الله-: كان أبي يأمر نساءه وبناته وخدمه بقيام اللَّيل ويقول:

« صلُّوا ولو ركعتين في جوف اللَّيل، فإنَّ الصَّلاة في جوف اللَّيل تحطُّ الأوزار وهي أشرف أعمال الصَّالحين»

طەلحەی کوڕی موصەریف فەرموویەتی : باوکم فەرمانی دەکرد بە خێزانەکانی و کچەکانی و خزمەتکارەکانی شەونوێژ بکەن و دەیفەرموو :

« نوێژ بکەن گەر دوو ڕکاتیش بێت لە ناوەڕاستی . ناوجەرگەی- شەو ، چونکە نوێژ کردن لە ناو جەرگەی شەودا تاوانەکان هەڵدەوەرێنێت ، وە باشترین کاری پیاوچاکانە»

**التهجد وقيام الليل لابن أبي الدنيا**

پیاوچاکان ئاوابون خۆیان شەو نوێژیان دەکرد و ماڵ و منداڵیشیان هەڵدەساند بۆ ئەنجامدانی شەونوێژ ، لەم سەردەمەش نوێژی تەراویحی بەلاوە قورسە بیکات دەڵێت سوننەتە واجب نیە !!

## هەڵە زۆربادەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ـ ٣٠ ـ

کۆتا ڕۆژی مانگی ڕەمەزان تەنها ماڵئاویی ناکات لە مانگی ڕەمەزان بەڵکو لە قورئان خوێندن و زیکرو شەونوێژو عیبادەت کردن !

مانگێک خۆت ماندوو کردوە نوێژو و ڕۆژو زیکر و شەونوێژ و خێرو صەدەقە و هتد .. ، چالاك بویت بەڵام شەوی جەژن ماڵئاوییان لێمەکە ، خوشکی بەڕێزم لەچکت کردوە لەم مانگە شەوی جەژن فڕێی مەدە ..

سەرفرازی بۆ ئەوانەی لە مانگی ڕەمەزان ڕەزامەندی الله یان بەدەست هێنا و چالاك بون لە عیبادەتکردن ، سەرفرازی بۆ ئەوانەی بەردەوام دەبن دوای ڕەمەزان ان شاء الله تعالى ..

لەکۆتایدا :

ئومێدەوارم توانیبێتم تیشکێکی بچوکم خستبێتە سەر هەڵەکانمان و بتوانین چارەسەریان بکەین لە کەمترین کاتتدا ، دیندارییەکی ڕاست و دروست بکەین بەو شێوازەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کردی و هاوەڵانیشی فێرکرد

، هیوادارم ئەم مانگی ڕەمەزانە ببێتە پێداچونەوەمان و تەوبە بکەین و بگەڕێینەوە بۆ دینداری و خواناسی .

و صلى الله على رسوله سيدنا محمد النبي وآله وسلم

محمد حميد

ڕەمەزانی ( **١٤٤٣** هـ . **٢٠٢٢** ز )